(سەفەر پارچەیێ سزاو مەینەتەو، کۆڵێ ئەرك‌و ئازارە، ئەوەتا نان و ئاوو خەوو خۆراکتان لێ هەراسان دەکا، دەی کەواتە، هەرکاتێ کە مەبەستی سەفەرەکەتان هاتە دیی، ئیتر بێ درەنگ بگەڕێنەوە بۆلای کەس و کارتان). (ریاض/٨٠١/٣ ز-١٧٥- ش. بەشی کوردی).

## پایانێ

مامۆستای عەسقەلان ڕەحمەتی خودای لێبێ دەفەرموێ: (باسەکانی عەمرەو باسەکانی دەستوورەکانی گەڕانەوە لە سەفەر، کەوا لەپاش ئەم باسانەی عەمرەوە، چل فەرموودەی بەرزەوە بوی لەخۆی گرتووە، چواریان بێ ڕشتەن، ئەوانەی تریان پەیوەستن، بیست‌و یەکیان دووبارەن، موسلیمیش ڕەحمەتی خودای لێبێ هەموویانی گێڕاوەتەوە، جگە لەم فەرموودانە:

١. (١٧٧٤ف) لە (ت)دا نییە.
٢. (أعتمار النبی قبل الحج – حديث البراء فيه) (٨٢٣ت = ١٧٨١ف).
٣. فەرموودەی عائیشە: (العمرة علی قدر النصب). (١٧٨٧ف = ٨٢٦ م ت)
٤. (٨٢٩ت = ١٧٩٨ف) حديث ابن عباس فی إرداف اثنين.

هەروا مامۆستای عەسقەلان دەفەرموێ: پێنج بیسراوی مەوقووفیشی وا تیادا، سیانیان پەیوەستن، لەزیمنی حەدیسەکەی بەڕادان. لەتەجریدەکەدا (١٥) یان هەیە ئاوا: (٨٣٣ – ٨١٨ = ١٥).

**تێبینی**:

١. باسی حەج و عەمرە بە دوورو درێژی وا لە بەرگی دووەمی تاج الاصول دا، وەرگێراوە کوردییەکەی، لە لاپەڕە/ ١٤٩ وە هەتا لاپەڕە/٢٩٥. واتە: لە زنجیرەی حەفتاو هەشتەوە، هەتا زنجیرەی/١٤٤.

٢. باسی حەج و عەمرە لە (ریاض الصالحین)دا، وەرگێراوە کوردییەکەی، وا لە بەرگی/٣ م /٩٣١ ز/٢٣٣.

٣. لە فیقهی ئاسان دا، وەرگێراوە کوردییەکەی، وا لەبەرگی یەکەم دا، لاپەڕە/٣٥١ هەتا لاپەڕە/٤٢٨. واتە: لەزنجیرە/١٥٧ هەتا زنجیرە/١٨٤.

بەپشتی خودا موتالاکردنی ئەم شوێنانەش بۆ کەسی خۆی بێ بەهرە نابێ.

وەرگێڕ
نوری فارس حەمەخان
سلێمانی/ مامۆستایان
٢٠٠٢/١٠/٢٥

# پێڕستی سەرباسەکان